ئەوەی ئاخریان هەربەنۆبە بو
ساڵێ دوازدەیی مانگ تا تەواو دەبو

یانی نۆریان لەخستە سەردێ
بۆماڵی ئاغا هەر ڕۆژە ، ... ، یەکێ

نۆرەکەیبەسەر جا خۆیو شانسی
دەمیان قەپان بوو گزیری برسی

یەک کەڵەشێریا یا چەند بلڕۆکە
دەبو حازر بن لە بۆ نۆرەکە

دەبو کەچ نەبێ لە ئەمری گزیر
چونکە گزیریش دەناسرا بە زیرا

لە نێو عالەما سەری بەرزبوا
قسەی گزیران تەغیری نەبوو

جالەوەبێجگە لە کوێخا ڕوتە ...
کوێخا ڕوتەکەش دەست کوت بزوتە

لە خەرایە دابەرگریان نەبو
دەوری ئاغاکان ئابەم جۆرە بو

## « بەشی نوهەم»

زوڵمی ئاغاکان باسی ناکرێ
هەتا بە هیچ کەس تەفسیر نادرێ

زوڵمێکی زۆریان لەرەعیەت دەکرد
لەهەموو حەددو نا موسیان ئەبرد

وەها دەفەرموێ قورئان بە یەقین
لعنه الله علی الضالمین

قورئان لە چەند جێ ئاماژەی کردوە
هەر ئەم ئایەتەی دوبارە کردوە

والله لایُحِبُ الضالمین
لە بۆنمونە ئەی کاکی بەدین

خودا دەفەرموێ بۆمان بە یەقین
والله لا یهدی الضالمین

نازانم بۆچی ئێستا مەلاکان
ئاخ هەڵ دەخوازن دەوری ئەوان

من خۆم بیستومە لە بەعزێ مەلا
دینیش نامێنێ کە ئاغا نەما

نەخێر وانیە خەراب حاڵێ بوون
ئەو مەلایانەش دوا دنیا کەوتوون

ئەو مەلایانەش هەر ئاغابەڵێن
دنیا پەرستن بۆ یە وائەڵێن

بۆئەوەی سبەی خەڵاتی بکا.
فتوا بە ناحەق بۆ ئاغا دەدا

زوڵم و دین زیددن پێکەو نایەن
ڕەگ و ڕیشەی دین دەردێنن لەبن

نازانم بۆچی ئەو مەلا یانە
گوێڵی ئاغان بەو عیلمە جوانە

ئاغانم هەموو رۆڵمە ئەنوێنێ
نازانم بۆچی مەلا نایبینێ

یا خۆ گێل دەکا لەو ئایە تانە
کە خوا فەرموویە بەو زاڵمانە

هەرکەسێ کۆمەک بکا بە زاڵم !
شەریکی ئەوەشا وتربەماڵم !

بۆ تە وەسیلەی بۆزۆڵم و ئازار
ئەو زاڵمترە لە ئاغای زۆر دلار

چون کە ئەو دنیای بۆ ئەژغاڵ دەکا
چون کە ئەو خەڵکی بۆ ئیغفال دەکا

مەلا بۆ خاتری گیرفان و پارە
بۆتە موجتەهید لە لا دێ و شارە

بە قسەی مەلاکان خەڵکی دێیەکان
ماڵیان حەرامە و گۆشت لە حەرامان

چونکە بێ ئیزنی ئاغا لە وێن
چۆن لە کەمێ ئاغایە زۆربەش ئەدوێن

بەکسەی کاک مەلالەم زەوی و زارە
گۆشتی حەرامە خۆ زاری مارە

وەک خوابۆ خۆی تاعینی کرد بێ
فەقەت بۆ ئاغا زەویی دانابێ

ئاغاشی بەجیا دروست کرد بێ
بۆ زوڵمو و زۆری لەسەر لەرزێ بێ

گەل وەکو کەر و گاو و بزن و مەر
تەماشا بکات بەبێ دەردی سەر

وەک گا، وەکو کەر بمان فرۆشێ
بۆ زوڵمو و زۆری هەرتێ بکۆشێ

ئاخۆ زەویەکان بۆ چی هی‌ئاغان
کێ ئاگایی لێ بووە بە چەندەکریان

هەربەزۆر داری داگیریان کردوە
مڵکی ئاغاکان ئابەم جۆرە بووە

## بەشی سێهەم

ئەی برای کوردم تا باش بزانی
ئاغاکان مڵکیان چۆن بە دەس هانی

بەچەند جۆر ئاغا مڵکیان دەس کەوت
یا بە زۆر داری یا بە ڕێ‌کەوت

یا بە جەردەیی و ڕێگری وڵات
یا خۆتڵان و بردنی مڵەت

یا ڕەشە کوژی لە مەنتیقە دا
دەبوونە حاکم بە و جۆرە ئاغا

ئاوا پەیدا بون ئەشرافی ئاغا
وەکو گیا کە لە ڕەگیان داکوتا

کاک مەلاش دەڵێ ملکی ڕەعیەتان
کەئاوا بیخۆن حەرامە بۆ یان

بە چەندەحیلێک پێت سابت دەکەم
کە حەرام لیە ئەو مڵکە سەرجەم

یەکەم ئەو مڵکە ئیخۆیان نەبوو
وەکو شەرحم دا دەستیان کەوتبو

دوهەم زوڵم بوون لە ڕادەبەدەر
خەڵکیان چاوئەکرد بە گاو و بەکەر

خودای ئەو خەڵکە گرتنی هەمو
باوی ئاغا کان لەخت و فەنا بوو

سێهەم ئایەتی قورئان دەلیلە
وەک مانگ دیارە مەکەوە پیلە

لعنة الله على الظالمين
بۆ ئاغا کانیش دەس دەدایە قین

## بەشی چوارەم

ئەو ئاغایانەی لە چەرخی منا
زوڵمیان ئەکرد ئەمانەی برا

ئاغای پژدەری زۆر بە ناوبانگ بوون
زۆر بێ بەزەیی و زۆر بێ ئیمان بون

بۆ زوڵم و زۆری وەک وەحشی کێوان
لە بۆقێڵ بازی هەروەکو شەیتان

بۆ پیاو کوشتن زۆر بێ شەرم بوون
زۆر ڕق لەستورو کەللە گەرم بوون

پێتو بەردێکیان بە سەگ دا دلرایە
دەبوو لەوکەسە هەر بکوژرایە
حوکمی سێدارەی بۆ سادر دەبوو
دەیان کوشت چونکە دەسەڵات نەبوو

سەی ئاغا ئەگەر سەد کەسی خواردبا
کەس نەیدەوێرا بەردی پێدادا

دەستوریان وابو ئاغای پژدەری
لەسەر یەک سەگی چەندپیاو بکوژرێ

زۆر بێ ئینساف و گەلێ بێ دین بوون
زۆر کەللە ڕەق و زۆر ناشیرین بوون

مەست و مل هوڕو دور لە ئەجابەت
لە ترسی ئەوان شەیتان هەڵ دەهات

دنیا گەڕبو بەلاف و گەزاف
شەیتان هەڵاتبو بۆپاش کێوی قاف

بەکوردی دەڵێم ئاغای پژدەری
باسی پیسیان هەر گیز ناکرێ

دەزانەوان چی و ئەوکورتە باسە
ئاغای پژدەرێ خودانەناسە

لە دیوی ئێراق ئاغای پژدەری
لەدیوی ئێران ئاغای مەنگوڕی

میراو دەلیە کان لە خاکی ئێراق
ناویان ڕۆیبو بۆ هەمو ئافاق

ناوی بەد ناوی میراو دەلیەکان
دنیایی کرد بو بە تاریکستان

هەرکەسێ ناوی ئەوانی ئەبیست
تفی لێ دەکرد ، دەرحال ئەی دەویست

ئەی دەویست ناوی ئەوان بیبیستێ
کەسێکی کەوا لێیان بترسێ

ئەوخاکەی ئەوان ئەسەری دەژیان
خاکی ئیراق بو بۆم کردی بەیان

خەڵکی ئەوجێیە لێت بێ عەیان
وەکوماری سەر ئەژوری دەخزان !

کەمیان دیبا ئاغا دیارە
دەرنەدەکەوتن هەتا ئێوارە

هەر لەکۆنەوە زوڵم لێ چوبوون
بەزوڵمی ئاغا چاو ترسێن بوون

هەتا شۆڕشی مەلا مستەفا
وەکو ڕۆژ هەڵات لەم وڵاتەدا

وەرزێرو جوتێر ، خوێندکار و مەلا
هەمو ڕاپەڕین لەزوڵمی ئاغا

بولەپێش مەرگە لە بۆ رزگاری
ئابرو خێنن کوشتی زۆر داری

ئابروخێنن کوشتی نەفامی
بوونەپێشمەرگە زۆر بە ئارامی

بوونە پێشمەرگەی وڵات و وەتەن
بەرگری کرا بوون لە عیلم و لەفەن

بوبەسەر پەلیان کاک عومەر عەلی
زۆری لێ کوشتن لە میراد و دەلی

سەرەنجام ئەما ئاغا لە ئێراق
بوون بە پەلدی جیهان و ئافاق

خولاسە بڵێین بە موختەسەری
مەجبور بوون بەوەیکەن نۆکەری

ئەگەر لە ئاغای ئێراق دەپرسی
بوون بە نۆکەری دەوڵەتی بەعسی

« بەشی پێنجەم»

ئاغا لە هەر جێ لە دووی قودرەتن
کە دەستیان نەبو لە گەڵ دەوڵەتن

بێنیەوە باسی وڵاتی خۆمان
زوڵمی ئاغاکان لە خاکی ئێران

ئاغای سوێسنیان ، لەگەڵ گەورکان
گەلێک زوڵم بوون ، مەعدوم براگیان

گەورکی لەودیو بە حسیان ناکرێ
زوڵمی زۆریان قەڵەم نایبڕێ

بۆت بکەم باسی ئاغای مەنگوڕی
باش گوێ بگرە بۆم وەک موشتەری

خەڵکیان خستبوە ژێر باری گران
دنیا لە خەڵکی ببۆ بەندیندان

دنیا ئەو ڕۆژە دۆزەخ ئاسابو
لەڕەعیەتی ڕوت باڵی تەندرابو

نەیان دەوێرا بڕۆن بۆجێ تر
بەسرابونەوە لە وڵاخ چاکر

ئاغای مەنگوڕی بێناموس و نەنگ
دنیایی ڕوناکیان لێ کرد بون تەنگ

ئاغای مەنگوڕی و ئاغای گەورکان
لە یەیەک نزیک بوون لەزوڵما یەکسان

دەڵێن ئەو دوانە زۆر دلۆین پیس بون
زۆر بێ شعور و زۆر نائەمیز بوون

دەڵێن لە دنیەک زۆرداری بوە
زۆر بێ ئەدەب و بێشعور بوە

هەرکەسێ کەوا ژنی بێنایە
دەبوولەوەڵ شەو بەوی بدایە

ئاغا دەیەویست تەنیا بۆ ئەوەی
کەبیکابەژن لە کچێنیەکەی

زۆر بەی ئاغاکان لە ناوچەکانا
هەموویان وابون لە کوردوستانا

دنیا بۆ خەڵک وا خەفەقان بو
ڕۆژی ڕوناکی لە هیچ دێ نەبو

هیچ شوێنێ نەبو خەڵک رویی تێکا
هەتا کو زوڵم و زۆر قەبوڵ نەکا

هیچ جێ نەمابو پەنایی بۆ ببا
مەجبور ، ناعیلاج ، دەبو دەنگ نەکا

چۆن لەگەر دەنگی کردبا کە سێ
ئاغای زوردارییش هەڵی داوەسێ

تەمبێ دەکران زۆر بە ناپاکی
زینی لەوانە زۆر بە هیلاکی

قودرەتیان نەبو لە هیچ جێرەعیەت
بەرگری بکەن لەزوڵم و زیللەت

## «بەشی شەشەم»

مەرجی ئەوەڵیان زوڵم و زۆری
لە بۆ خوێن مژی بۆ خوێن خۆری

یەکێتیان نەبو ئاغا کانی شەڕۆ
بۆیە هەرئاوابون بە درو

ئاغالە ئێراق ، ئاغا لە ئێران
فەرقیان نەبو ، بۆ زوڵم و زیندان

ڕەعیەت لە ئێران کەباری دەکرد
للغالە ئێراق رایان نەدەگرت

دوهەم دەوڵەتی نەبو لەو وەختە
بەرگری بکات لەو کارە چەوتە

سێهەم خەڵکیان لەچەوساندەوە
هەرنەیان دەهێشت بیوژێتەوە

لەبەرفەقیری قودرەتیان نەبو
هەستن راپەڕن ئلوا زوبە زو

## «بەشی هەوتەم»

بێینە سەرباسی بەگزادەی بانە
ئەوان مەشهورن لەو کوردوستانە

وایان پێدەڵێن بە بە گزادەکان
ئەویان مەشهورە بە بەگ و بە خان

ئەوخان و بەگە بۆت بکەم بەیان
دەماو سیفەتن ئلغا هەمویان

زۆر قۆڕدەماغن ئەوخان و بەگە
لەو سیفەتەتیان ، خۆ هینی سەگە

بۆ دەماو زلی وەک کەر و گا وان
شەیتان بۆ دەرس لەچێتە لای وان

ئەوان ناوی دین زۆر باش دەزانن
بەڵان داخەکەم ، خویان شەیتانن

دەڵێن پیاوەتی لەلای ئاغایە
بەئەوری کوڵلی ماڵی سەرایە

بەراستی ئەوان گەلێ مەغرورن
لە ئاستی مەردی گەلێ بە دورن

زەمانی قەدیم بەگ و خانەکان
مەتبەقیان هەبو لە دێهاتەکان

لەرەعیەتەکان جوێ دەبونەوە
هەمو لە یەک جێ کۆ دەبونەوە

قسەیان لە گەل رەعیەت نەدەکرد
بەچاوی سوکیان تەماشا دەکرد

کەس نەیدەوێرا رەعیەتەکان
قسەی دەربرێ لەروی خانەکان

چونکە لە بەر خان کەس ئیزنی نەبو
دەورەی خانەکان لەبەو جۆرەبو

ئەگەر خان روی خۆیی گرژ کردایە
رەعیەت هەر دەبو خوی بکوشتایە

بێ ئەوەی ژینی خۆی لەدەست دابوو
دین و ناموسیان هەر بۆ ئاغابو

نەخاوەنی ژن ، نەخاوەنی ماڵ
ئاغا داینا بو هەروەکوگوێبال

نەخاوەنی خۆی نەدەسانەوە
خەڵک زەلیل بون بە دەس خانەوە

کوڕی خان هەروەک کەری بەهاران
بەرەڵابێ چێ بۆ گوڵان

نێوبوێ دەکەوت بە ئارەزووی خۆی
هیچ کەسێ نەبو لێ بکاتە ڕوی

کچی هەرکەسی کە پێی جوان بایە
فەسادی دەکرد لەو زۆڵە زایە

باسی زۆر داری خانی بە ڕەڵا
ئەوەندە زۆرە ، ناکرێ بە ئازا

دەبو ئەم باسە هەر بەئاوی زێڕ
بنوسرێتە وە هەموی دێڕ بە دێڕ

کەچی داخەکەم لەلەم بارەوە
دەست نوسێ نەبو کەبی خوێنمەوە

هەر ئەوەی بۆخۆم کەوەبیرم دێ
نوسیمەوانێ دەرحاڵ جێ بە جێ

لەبەو جۆرەیەتەماشای بکەن
ئێستا کەمیشە، باوەڕم پێ کەن

باسی خانەکان بەوجۆرەبووە
لەقەدیمیانی ناوچەم بیستووە

وایان دەزانی کە ئەو عالەمە
هۆشیان نەماوە لائاڵیان کەمە

خودا بۆ ئێمەی موئەددەم کردون!
لەژێر فەرمانا هەردەبێ مردون!

دەیان گوت ئێمە پاکین و ئێوەش
پیسن،هەر بۆیە کراون بێ بەش

خوقەبەر ئێمە دروستی کردون !
وەگەر نا ئێوە هەرگیزنەدەبون!

لە دنیای ڕون دا ، بێبەشی ژیان
لەڕۆژی جەزا بێ بەشی دینن

ئەوەی گەرمەیەت بە ڕەنجی شانی
پێکیەوە دەنا دەیدا بە خانی

ئەوەی گەرمەیەت پەیدایان دەکرد
ئاغا سمێڵیان پێ چەور دەکرد

گەوش کە نەبوبێکەنە پێیان
بە کڵە و پێتا ئەبوونە شوان

خانیش قۆندەرەیی لێ هەڵ دەکێشا
بۆ ئیسراحەتێ دەچو بۆ مەزرا

جوتێر بەم جۆرە نان پەیابکا
بۆخۆی نەیخوا بیدا بە ئاغا

ئەم بەکڵەکۆن لاقی ئەسوتێ
خانیش هاتووە بۆ ئیسراحەتێ

بێتو بیدیایە بێ جلی پینە
دەسەڵاتی بوەچوبە قینە

ئیتربێ ئەوەی لە فیکری دابێ
ئەویش ئینسانە و ژیانی دەوێ

دورلە مەعریفەت ، دور لە عەداڵەت
دور لە ویژدانی هەی خانی نەگبەت

هەی خانی نەگبەت پیسی ترش رو
هەرچی ئاغایە نیانە ئابرو

بێحەیاو نەفام تۆ والەزانی
لە جێی خودایی و لە جێی یەزدانی

ئەوعالەمەی وا لەژێر دەستی تۆن
هەموخوابەتوی خەفەمندە کردون

تۆ والەزانی کە ئەم عالەمە
هەمویی ئیتۆیە چزۆر و کەمە

لێت گەڕێن ئیترچی دەکەی بیکەی
خەریکی ئاوا دنیای پیس‌کەی

بە هۆیی چەتەیی و جەردەیی ، زوڵم
بیوی بە ئاغا بیوی بە حاکم

بە بیانوی دوکوتی، زەمین لامەزەب
داگیرت کردو لەویش بە غەزەب

وەکو فیرعەون کە تۆغیانی کرد
دەس بە جێ داوای خودایەتی کرد

لەوتۆغیانەدا زۆری پێ نەچو
لەروباری فیل فەوت و فەنابو

خودا موسایی نارد بۆ پێغەمبەری
عەداڵەت هات و زوڵم دەربەری

هەتا قیامەت نابڕێتەوە
چوبزەهەنەم قەت نابەتەوە

کەسێ خودا بیکا بە پەندی ڕۆژگار
هەتاهەتایێ دەبێ گرفتار

ئێوەش هەر وەها وەکوفیرعەون
بەهەموتاکار شەبیهی ئەون

کەبون بە پەندی بلاوزەمانە
سەرشۆڕن سەر شۆڕ لە ڕووی جیهانە

ئەی ئەفلامینە لێستانش بەتەمان
بینە وە ئاغا کەی جاری جاران

چوون مفتەخۆرن بێ ئاڵ و ئەمام
هاتون لە زێڵاا بە نانی حەرام

بەنانی خەڵکی بەمەختەو بێ کار
دەیرەوتاندەوە ڕەعیەتی هەزار

## بەشی هەشتەم

ئەنبازی ئاغا ، کوناوکون گەنم
تێیدائەمادوە دەدرا بە کرم

ڕەعیەت بەهاران ، زوو لێیان دەبڕا
دەچوبژ گەنم ، بزئەولاو و ئەولا

وڵات گرانی لێ پەیدا دەبو
ئینسان ، ئینسانی دەخوارد سڵی زو

ساڵی گرانی ڕۆژی ئاغا بو
کڕینی چەندەدنی لەزەین دابو

ئەگەر لە بڕسان چەندە کەس بمرێ
بازاری ئاغا گەرمتر دەبێ

بەمردنی وان قیمەتی ئەکرد
ئاغا هەربۆیە حەسباری دەکرد

لەوکەتەی کە وابەدەستی ئێوە
ئەی کاکی جوتێر بەرهەمی ئێوە

بەزەحمەتی ئێوە پەیدا دەکرا
کردەکرایەوە دە درابەئاغا

ئاغا ئیحتیاجی بەگەنم نەبو
کۆی دەکردەوە هەتا زۆر ئەبو

گەنمی سێ ساڵەی لەکەوتە سەریەک
کە گران دەبو ئەیدا بە چەندیەک

ڕۆنی خۆیانی لەخۆیان لەدا
بەو جۆرە خوێنی دەمژین ئاغا

گرانی ساڵان کە پەیدا دەبو
هۆی هەرە گەورەیی ملەئاغابو

ئاغا ڕیشەکەی لەزوڵما ڕوا
بەئاوی زوڵم ئاوپاشی کرا

زوڵم کراسەپۆیلای ئاغا
لەبەری دەکا و ناوی لێ لەبا

زوڵم چەند ڕۆژێک بەسەر دارەوە
دەناڵایەکەی واڵە خوارە وە

موژدە بێ لێتان ئەی جوتیاران
ئاغانە ملوە بێتە وەسەرتان

بێتەوە بڵێ بۆ بیگار هاتووم
لەبۆخەراج و خاروبار هاتووم

بێتەوە بڵێ لەبۆ کسیکانە
سورانەی خەرمان لەبۆ پوشانە

مەخلەو زەکات و فروجالەکەت
بۆ دیارنە بوبی کوا، جێژنانەکەت

ملکو ملەکەی ئاغا کەی زۆر دار
ئاوابەبدابو ئەی کاکی هوشیار

خوالە قورئانا نەفرین لەفەرموێ
بۆهەرکەسێکی کەوا زاڵم بێ

لعنةالله علی الضّالمین
ڕودەکاتە سەر ئاغای دورلەدین

جابزانە دەر کەوت بەسەروروکات
ملکی ئاغاکان بەزوڵم دەرهات

## بەشی نۆهەم

براکەم ڕەعیەت ئەم هەمو ڕەنجە
دەبێ بکێشێ بەبەری پەنجە

دەبێ عەبد بێ هەتا هەتایە
بۆمەگەر ئاغا بۆوان خودایە؟

لە هەر دێیەکو لە هەر وڵاتی
برام ئاوایە بێ دەسەڵاتی

دەبێ هەتاکەی زوڵمیان لێ کەن
وەکو کەرگاژێر باران بخەن

ئەوان بۆ جیشە و قیافە گرتن
ئەمانیش لە ژێر زوڵم و زۆر مردن

هەر کەس بۆلای خوی لەکێشی برا
پەندی پێشینیان باش لە گوێ گرا

عەدالەت نەما لە هەر وڵاتێ
عەدالەت ڕقێبی زوڵم دێتە جێ

لە ژێرپێ دەخوێ حەققی فەقیران
ناگیرێ قەدری دراوسێ و جیران

ئەمجارە دەستێک ڕێ گرو جەردە
گلاوی دەکەن ئەم خاک و هەردە

لەوەتی خودا دنیای داناوە
زوڵم هەربووە لە بۆ ئازاوە

وەکو ماری سیس سەر لە بۆر ئەنێن
لە هەل و مەرج و دەرفەت ئەگەڕێن

هەر لە هەوڵ دان بۆ فورسەتی باش
یا ئەبنە جاسوس یا ئەبن بە جاش

بۆ فورسەت نەبێ بڕۆ چاش خانە
هەمووی ئاغایە هەر دەڵێی خانە

بۆ ئەوەی کەوا هەروەکو جاران
بێنەوە ئاغا بۆسەر هەزاران

هەر بەقۆڵ و فوت لە گەڵ عالەمن
دوژمنی سەری بەنی ئادەمن

ئێستا خدرە گێل خۆی گێل کردوە
ئەوەی بزانن ماری نوستووە

چینێکیان جاسوس ، چینێکیان جاشن
چینێکیان لە گەڵ عالەمی باشن

باشە کانیشیان جێگای مەترسین
لە تۆ مەعلوم بێ ئەی برای شیرین

مام ... ئاغایێ دەڵێن چاشە
زۆر قسەی خۆشە پیاوێکی باشە

دەڵێن نازناوی باباخانە یە
لەگەڵ عالەمێ زۆر بەنەشەیە

هەتادەسی کاکی مام ... ئاغا
سەگ و ئینسانی پێکەوە دانا

دەیان گوت شەرت بێ ئاغای موکوریان
دەڵێن زورباشن لە گەڵ ڕەعیەتان

کەدەچنە بێگار نانیان دەدەنێ
ناهێڵن کابرا نانی خۆی بێ بێ

دەیان گوت کاکە ئاغای کوچەریٚ
ئەوان زۆر چاکن ، کەدەچنە دەری

مەڵیٚ یەک نەفەر ئەبەن بۆ بیگار
ئەوان زۆر باشن بۆ پیاوی نەدار

خەرابی ئەوان عەیٚبیکی کەیە
تەمای ئاموسیان لەخەڵکی هەیە

ئەمما هەر چاکە بەس نیە ...
لە چاو دەیٚ ئوندا، بیگاری کەمە

خلەبەبلەی دەگوت هۆبلە
دەڵیٚن جیم بانون ، پیاویکی زلە

ڕەعیەت لەرویانایی دانیشیٚ
نالیٚ بە ڕەوڕویی نەفەس بکیٚشیٚ

لیٚوەی دیارە غەزەبی خوا
هەرز دەلەرزیٚ لە ژیٚر دەستیدا

دەڵیٚن دەماری لەوەلدە زلە
سەر دەلەقلیٚنیٚ وەکو خول خولە

بلوکت لەدیبو مالەلدی شەیتان
دەت گوت بەرازەپیاوی دیوەخان

لەگەلیٚ نۆکەریٚلی قسەی نەدەکرد
بۆ کویٚخاروتە ئیشارەی دەکرد

مالەندی شەیتان دنیا دەیخاسی
ئاغا ببونە غولام وکەسی

پێی دەگوت خلە ، بلە ، بزانە
خێ، سێ، نون ، مەزن بولەلای بانە

بلوکی ڕێ، لون بو کەلیستا هەیە
کە بزعالەمێ جێگایی غوسەیە

لەدێ «ن، ش ، ڕ» قەلایەکی بو
بیژ فیرعەولی سالانی پێشو

گوێم لێ بو بلە دەیگوت خلەگیان
وەها نەماوە هەر وەکو سالان

قەلاتی ڕوخا وەکو لاشەکۆن
ئێستا ناوێرن خەلکی دێ بخۆن

قەلای« ڕ، ن، خ» ئاساری ماوە
بەلام دلخەکەم باش نەڕو خاوە

خلە مەردەلێ بلە قولە قول
لەولاسالەچن ئەیانلێی بە تول

بۆ دەلەی ، هەر هیچ هۆشت نەماوە
قسەمە لێزە بێرە بە ملاوە

باحالێت بکەم خەبەرات چییە
و ادیارە کە هیچ خەبەرت نیە

«ڕ، ب، خ» ئێستا لەشکردەکێشێ
بۆ گوندی «ئل» و بۆلەم دێ و ئەودێ

بۆنەت بیستوە چیان لە خولە کرد
چەندەیان لێ دابێ لابڕویان کرد

باغوباخاتیان هەمو وێران کرد
دەربەدەریان کردو مەڕیشیان بارکرد

مەجبور کاک خولە بوبە ئاوارە
بۆنەت بیستووە ئێستالەشارە

لەشاری بانە ژیان سەردەبەن
دورخراونەوە لە خاک ووەتەن

ڕەنجی چەن ساڵەی کاک خولە و ئەوان
بەهەردی ڕۆیی چوبۆ ئاسمان

لەو ڕۆژانە دا لە « جیمی» خوارو
پیلان گێرەکان هەروەکو پێشو

پیلان دەگێڕن بۆ خەڵکی ئێودێ
یەکێک دەکوتن بەتێکڕالە وێ

بەکۆمەڵ هەموڵێی دەدەن ئەوان
بە چاقوو بۆکس ، شەق و تێهەڵدان

ق، ن ، گ ، لێ وشیبن کوڕی
بەدەستی زۆری ئاغا دەخوری

« لێ و ش » جوێنی بە ئایین ئەدا
جوێن بە مەلا و جوێن بە خودا

جوێن بە شەرع و جوێن بە قورئان
جوێن بە جەمعی باقی جوتیاران

ق ، ن ، گ ، بابی ئاغاکان
بەتەرزی «ئەوش» کەوتنە جوێندان

بگره و بیکوژه «ق و ک» له وێ
بابزانین ئاخر چیان لێ بەسەردێ

شۆڕش و غەوغا کەوتە ئاوایی
دەگەڕان بۆ هەل دەستەی ئاغایی

خەڵکی ئاوایی بێ خەبەر لە حاڵ
شەش حەو نەفەرێک دەرپەڕین لە ماڵ

هەمزە و هەباس و وەسمان و نالە
کەکوێیان لێ بوڵەو گالە گالە

گالەو = ئێوشێن لەدێ دەگڕێ
ئەو ئامادەیە فەقەت بۆ شەڕێ

کوڵایان لەسیا زۆریش کەم نەبو
هەر حەیایی نیە ئاغای بێ ئابڕو

سەری شکاوە بە کوتک و بەدار
بەسەر سەری دا خوێن دەهاتە خوار

خوێنی ڕژابو بۆ سەربەرد و دار
پێچی دەخواردن وەک ماری ژەمار

دەیوت ئەو خوێنە هەر ناشۆمەوە
هەتا کو تۆڵەی خۆم نەکەمەوە

خۆی بە خۆی دەگوت دەک خەجاڵەتبی
کە خوێنی ڕشتی ڕەعیەتی خوێڕی

زوڵم زوڵمی خۆی هەرگیز نابینێ
بۆیە بەو شێوە، زۆری دەنوێنێ

زوڵمی بەد کار عادەتی وایە
زوڵم و زۆردە کا پێشی ڕەوایە

بۆ یەعنی خودئومەندی وەعنی فەرمووە
لەتیرەی زوڵم لە عنەتی کردوە

خولاسەی کەلام لەویْ خاڵە مەر
ئەم بەسەری هاڵەی گێڕاوە یەک سەر

خوله سپاسی کرد لە خاڵە مەر
وتی ئافەرین ، ئەتۆیی هونەروەر

ئەتۆزانایو ، پیاوی قەدیمی
بۆمان وەگێڕە باسی سەلیمی

خاڵە مەروتی بە خوا سالی زو
دەستەیەکیان بو لە «ج» خوارو

ساڵان سەلیم خان لە کیوە ڕۆبو
ئەو وەختە سەلیم ئاغای ئێوەبو

کوڕێکی هەبو بە ناو سەلیم خان
وەکودرەلدەیی سەروکی چەتان

ئەو ئاغایانەی لای دوڵی جمنە
چۆن بوکن ئەوی ببون بە چەتە

ماڵومنداڵیان لە دێری دانا
دێری دێکە لەوبەر چۆمانا

بائەوەش بڵێن لە بیرمان نەچیْ
بۆچی ئاغاکان ڕۆیین لە جمنیْ

لە پێش دا گوندان چۆن ژیاون ئاغا
ئاغاهەمیشە بەرزە دەماغا

تەقسیمی زەوی دەستی پێ کردبوو
رژێمی ئاغا سەراوژێر دەبوو

نەیان دەتوانی لەوێ دانیشن
وەکو جوتیاران ، زەحمەت بکێشن

نەشیان دەتوانی هەر وەکو جاران
زوڵم بێنە پێش بۆسەر جوتیاران

بۆ تەمبێ کردنی خەڵکی بێچارە
لە گوندی جێ بوون ئاوارە

هەتا لەوێوە جوتیاران بخۆن
بینە وە ئاغا وەکو دەوری کۆن

ئاغای هەموجێ بەو هیوایەبون
خەریکی حەللی ئەو سەودایەبوون

بەو جۆرە ئاغای جیمێ رویشتن
لەکسەری ئاغا چاویان لێ کردن

ئاغای شەمزڵە و ئاغای دەشتە ئالێ
ئاغای سیاوەمە بیونە گڕیالێ

هەمویان لەوێ کۆبیونەوە
بۆئەوەی ئاغا زێندوبینەوە

بیۆ رلو و روت لە کوردوستانا
ماوەیێ ئاوا دەوریان ئەگێرا

خەڵکی بێچارەی ئەم کوردوستانە
ئەوەڵی هەیە هەرلە زیندانە

ئەو لاش ژاندارم چوە جێی ئاغاکان
زوڵمی ژاندارم سەدشوکربەوان

دوژمنی جوتێر ئەوەڵ یەکێ بو
لەگەڵ ژاندارم ئێستابون بەدو

دوێنی خوێنەکەی دەمژی ئاغا
ئیستا بۆ مەرگت گورگە ڕاو دەکا

وتمان ئاغاکان خەریکی ئەوەن
هەروە کو جاران ئاغایی بکەن

ئیدی لە مەڕوێ بنکەیان دانا
ڕۆژی ئاغایە و ڕۆژی سەگانە

ملم ئاغای ئەوێ صیفەتی وابو
لە تەبیعەتا مەیمون ئاسابو

وەکو باس دەکەن پیرانی قەدیم
لێی دەگێڕنە وەبە عەقڵی سەلیم

چەند ژنی بوە جەنابی ئاغا
یەنی نەرە عیمت ئەوبدی ئاغا

ئەوەی ڕەعیەتی کە منداڵی با
لەبەینی دەبرد بەهەرجۆرێ با

پێی عەیب و عاربو ئەو لەم ڕەعیەتە
منداڵی بێ بڵێن ئیخواتە

تابڵێن ئەویش شێوە ئاغایە
تابڵێن خۆشی لە ڕەعیەت نایە

کوڕێکی هەبو لی پێنج شەش ساڵە
هیوای دایکی بو لەسەر ئەو ماڵە

چونکە ساڵانیش جەرگی سوتابو
لەتاو کوڕەکەی هۆشی نەمابو

هیوایی بەو کوڕە هەتاسەر لەبو
لەبەینی دەمیاڵاغای ترش ڕو

هەروەکو دوژمن چاویی لێ دەکرد
بەچاوی غەیان تەماشایی دەکرد

باوکی هەر وەها لە هەوڵ دابو
کوڕی بکوژێ ئاوازوبە زو

ئەیوت نەبەشکو کوڕ لە ئەوژنە
پێی بگالیتر بۆمن دوژمنە

کوڕی ئەوژنە بێتو گەورەبێ
لەسڵو ڕەسەنی ئێمە دەگۆڕێ

تانەوتەشەر و لۆمەش لەوێ بێ
دەبێ بیکوژم نابێ هەربێ

ڕۆژێ کوڕەکەی دەچێتە حەوزێ
بابۆڵە نانی پێ دەبێ لە وێ

باوکی بێ ڕەحم بە هەلی زانی
وەدلاوی کەوت لە حەوزو کانی

کوڕ ئەگەر زانی کەوا دەیکوژێ
بەنوکی خەنجەر خوێنی دەڕێژێ

ووتی بابە گیان لێم گەڕێ جارێ
ئەمن مەکوژە هەتا لێوارێ

ئوخوا بابە گیان ئاخر لەسەر چی
بێ خەتاو ئاوان ئەمن دەکوژی

لەسەرچی بۆ چی خەتام کردوە ؟
بوچیم دەکوژی ، ئاوابە وزووە؟

دەیوت بابەگیان جارێ لێم گەڕێ
بلبا بۆ ئەکەم بخۆم هەرنەبێ

گوتی بابەگیان زۆرم برسیە
بۆ وام لێدەکەی بۆ ڕوحمت نیە

پەردەی ڕەشی پیس دلێ داگرتبو
بۆیە بۆ کوڕە هیچ ڕوحمی نەبو

نەی هێشت کەبیخوا بابۆڵەیپەنیر
کوڕەکەی خنکاند هەربەبێ تەئسیر

خولاسەی کە لام مام دەروێشانا
ئابەو جۆرە بون هەمویان ئاغا

ڕەسمی مام ڕووتەڵ وەحشی ئاسابو
دایم سەدکەسی لە خزمەت دابو

لەبۆ چەتەیی ولە بۆ نۆکەری
بۆهەموکارێک ئەچوونە دەوری

لە لایەن ئاغای گەورک و سەرا
مام ڕووتەڵ خزمەت دەکرا

هەرکەسێ ئاوا موخلیفیان بان
وەجوڵابایەن سەرکوب دەکران

ئاغالە ئێراق ، ئاغا لە ئیران
مام ڕووتەڵ ببۆسەرۆکیان

لە هەموو لاوە خزمەتیان ئەکرد
بۆیە کاک ڕووتەڵ چەتەیی ئەکرد

مەخسوسەن ئاغای مەنیقەی بانە
خزمەتیان ئەکرد هەموی ئەوانە

دنیایی کردبو شەوەزەنگی تار
ئاغالە خەڵکی ببو نە ڕەش مار

خەڵکی بێ چارە و داماووفەقیر
هەموببونە غولام و گزیر

هیچ کەسی نەبو ئەم کوردستانە
دژی ئاغاکان بگرێ بەهانە

چونکە ئەوکارە گەلی گران بو
بۆخەڵکی هەژار دیاری نەکرا بو

کەس نەیدیە وێرا لەڕووی ئاغاکان
بڵێ دۆچەندە دەکرابە تاڵان

بەچلەی زستان دەکەوتە سارا
ماڵ و منداڵ لەسەرد لەبرسا

ئەمەبو پیشەی زوڵم و زۆر داری
کەڵێی شین ئەبو داری هەژاری

جابرادەران، ئەی گوێ گری نە
ئەم قسەڕاستەکەڵێ شیرینە

زوڵم پایەکەی لەپیسەوەدێ
بۆیە ئاوا زور لەبەین لەچێ

بەبێ دەمێنێ بەسەر دارەوە
دەناپاکەی والە خوارەوە

هەرکەسێ کەوا زوڵم پیشەبێ
هەرگیز مەرامی بۆ نایەتەجێ

ئەو زوڵمەی ئەوان لەخەڵکی دەکەن
بوتەباعیسی خەرابی وەتەن

وەتەن وێران بو بە دەستی ئەوان
ڕیشە و بنا خەی ژینیان ، ڕمان

تاسەدسڵی کەش چەر وەژا!
نابڕێتە وە، ئی زۆر داریە

لە هەمولاوە زۆر دار هەمیشە
جەرگی هەژاری بڕی لە ڕیشە

حەتتا نەیدە هێشت کەسێ بخوێنێ
نەیدە هێشت هەر گیزبەرمبسێنێ

لەبەر فەقیری و لەبەر کەم دەستی
بۆیە دەبینی ئاوابە سستی

نەیدە هێشت رەعیەت خانوی نوێوە کا
دەیوت زەمینم لێ کەسر دەکا

خانو هەر دەبو ئاغا دروستی کا
کەس نەیدەوێرا خانو دروست کا

بەویستی خۆیان چەند خانو ئاغا
دروستی دەکرد وەک تەویلەگا

دەگێرێتەوە یەکێ دەر کراو
کە خانوی ئاغایی بۆ کرابوتەواو

کە چوینە لەوێ مام کەریم ئاغا
خانوێکی داینێ کەیەک لوکاغا

خانو چ خانو خانوی رەعیەتان
دیوار تەنرا بو بەشولی لەیمان

بەربخی تەریش سواخ کرابو
وەک مانگاشەبەق سەدکولی تیابو

باوەشێک دوکەڵ لێی دەهاتە دەر
لێی دیاربو نیشانەی سەقەر

لە جیات چەنجەر کولانکەی سەربان
روناکی دەکرێ زوری دیوەخان

ئاغا نەیدەهێشت کەس هەبێ لیباس
بکڕێ لەبەر کات شەڵوار و کراس

ئیحترام بۆسەگ زۆر قایل دەبون
بەڵام بۆ ڕەعیەت هەر پیسترده بون

بەکورتی بڵێم مەنتیقەی بالە
جەنابی « حێ خێ» شێخە کەیانە

تەبیعەت مەلازۆر لەدین دایە
سنحضب سیواکە و پیاوی خودایە

لەدەوری خوێندا لەوپیاوەباشە
لەدینی ئیسلام کردبوی حاشە

باوەڕ ناکاپێی کەسێکی زیرە
هێلی خوار لە بن سەری گای پیرە

جەنابی « حێ ، خێ» لە گوندی «م» دە
بە ئالقیدەی خۆی پیاوێکی وردە

لەژێر سێبەری قورئان و حەدیس
کاری وادەکات جاچیە ئیبلیس

وشکە مەلاکان تەوسیفی دەکەن
پێ بەخێڵ بازی ئەو خڵە نابەن

نازانن گورگەلەپێستی مەڕدا
ڕەطیلی کێیە لە کاتی شەڕدا

کەشوان دیار نییە دەیان خنکێنی
بۆگورگی کێویش سەر دەلەقێنی

جەنابی «حێ خێ» ئاوابوینە
لەژێر سێبەری مەزهەب و دینە

ناوی خۆی ناوە حەبیبی دەوران
گۆیا عەبدێکە لەزێکی قورئان

بەپێچەوانە برام وایە
پیاوێکی ئاوا مەزهەبی نیە

پیاوی مەزهەبی دورە لە گوناه
دورە لە کیبر و لە کاری ڕیاه

ناوی زل بۆخۆی هەڵنابژێرێ
بۆقسەی لەم و لەو گوێ ڕادەدێرێ

ناچی بۆسەری مەجلس دانیشێ
هەربەدەستی خۆیی ڕەنجی دەکێشێ

نابینە سەر بار بۆ زوڵم و زۆری
ناکا خوێن مژی ، ناکا خوێن خۆری

ئینسان بۆ گوناه ئەوەندەی بەسە
پیاوی خۆ پێ زل پەستترین کەسە

جەنابی « ج ، غ» لە گوندی «ن،سن»
شەبیهی ئەوە ئەی برای شیرین

باسی «ج، د، ر» هەرگیز ناکرێ
بەهیەکی وەک من تەفسیرناکرێ

پێچەوە ئاغاکان هەموبەجێ خۆی
«خ، د،ر» مەزن حەسابەبۆخۆی

هەرچی بیکوتالسەی رە وابو
قسەی « خ، د، ر» بەرێوە دەچو

گەربەکەیفی خۆی هەر لەسەر جۆبێ
عەجایب نیە دنیاگەر بێ

وەکو نەرە شێر دەس دەکلبەزەر
بەدەنگی ئەوی دنیا دەبێ کەر

دنیا پڕ بیو لە درۆ و دەلەسە
بەرز بیۆوە هەرچی ناکەسە

لەباسی ئاغاو باسی مل زلی
تێدا دەخنکان هەتاکو ملی

نەت دەبیست باسی فەقیری بکەن
ئەو وەختە وێران کرابو وەتەن

بەدەستی ئاغا و وشکە مەلاکان
وێران کرابو نیشتمانی جوان

رۆژ رۆژی ئاغا و کۆلکە مەلابو
زۆر باشیان دەخوارد سەلاّی پێشو

ئاغا کان بەپێی سیاسەتی خۆیان
دەچون چەند کۆلکە مەلایان دێنان

ئەوانیش لەبەر بەرات و پارە
ئایەتی خوایان بەلاێری دەدا

دەیان شاردەوە ئەو ئایەتانە
دژی زۆرداری ودژە زوڵمانە

لەباتی خەڵکی تێ بگەیێنن
رایان پەرێنن بەدژی دوژمن

ئەیان وت قورئان مەعنا ناکرێ
کەسێ مەعنای کاچاوی کوێردەبێ

حەتتا لە مانای سورەی فاتیحا
خۆیان ئەپاراست ئەیان کرد بەلا

ایاک نعبد» برام وادەڵێ
سەربۆ خوا دانەو هیچی ترمەڵێ

یانی لە هیچ کەس ئەتۆمەترسە
فەقەت بۆ خوا سەرت دانەوە

هەر خودا لایق بە پەرەستنە
هەر خوا خێرو شەری لە کنە

خێرو شەر برام، هەربۆ خودایە
بەپێچە وانە ، نەک بە ئاغایە

ئاغا کانی کۆن وەکوبت وابون
وشکە مەلاکان ، پەرزیان کردبون

هەر مەلا دەبێ کاری وابکا
کەئاغای هەبێ سوجدەی بۆببا

بۆ ئەبو جەهل هەر ئاغائەبو
لە پیغەمبەری ببو بە عەدو

لەبەر ڕیاسەت ، ڕەگەز پەرستی
لەبەر دەمارو هەوەسی پەستی

بوو بە تەعەسوب بۆ دینی ئیسلام
بووە دوژمنی ڕەسوڵی ئەنام

چونکە ئەودینەی کەئەو هێنابوی
بەرگری دەکرد لەرەفتار و خویی

خوو ڕەوشتی وان ئاغایەتی بوو
لەگەڵ موحەممەد دژایەتی

چۆن دینی ئیسلام دینی خودایە
خۆئاغا خۆشیان لە خودا ئایە

مام ئەبوجەهل یا ئەبولەهەب
ئاغای مەککە بوون هەردو لامەسەب

خودا ئایەتی ناردە سەر زەوی
فەرمویی ئەوانە قەت ئەمین نەبی

خوا بە ئەمری خۆیی دوعایی لێ کردن
لە دنیای ڕوناکەبەینی بردن

بە « تبت یدا ابی لهب»
باڵی دو دەستی باڵە بەین چن

دورنیە یەکیان ئەبو جەهل بێ
ئەوەی دیکە یان ئەبو لەهەب بێ

چۆن ئەوان سەرەی دوناپەڕەبون
دژی موحەممەد یەک گرتو بوون

زۆری پێ نەچو هەر دوی ئەوانە
بون بە عیبرەتی چەرخی زەمانە

باسی خەرابی هەر نابڕێتەوە
هەتا هەتایێ دەگوترێتەوە

ڕیشەو ڕەگەزی جینایەتیەکان
لەوێ وەهاتون هەتاکو ئەلان

بەکورتی بلێین پێلەکی ئاغا
لەشاری مەککە ڕەگەیی داکوتا

چونکە بە عزێکیان هەر مابونەوە
جابەدنیا دا بڵا و بونەوە

من هەر بەهیوام ڕیشە بڕ کرێن
لە هەمو جێگاو لە هەمو شوێن

من هیوا دارم ناویان لەمێنێ
بەگ و خانەکان لە هیچ شوێنێ

نوسیم بەشیعر ناوی هەندێکیان
بەپیشتیوانی خواوەندی یەزدان

با پێشت بڵێم ئەی کاکی وریا
هێنامە دەرێ قەترە لە دەریا

هەرکەس بە پێی خۆی بینوسێتەوە
هەتاکو دنیا دەبڕێتەوە

هەرئەولو نابێ ئێستا هەر کەمە
چونکە لە ئەقلی بەشەر دا خەمە

ڕێبەندانی /١٣٦٦

## «نامیلکەی دوهەم»

ئەم نامەیە دەنوسم    بەنێوی خودای گەورە
بە خوێنی هەژارەکان    ئاغا سمێلی چەورە

ئاغاکەملی بانە    خوێنی من و تۆی مژی
هەرواکە لە سەرمانە    رابوەستین بە دژی

بەدەستی ڕەنجی من و تۆ    شان و بلشۆی قەوی‌بو
بەفێڵ و بەمل هوڕی    حاکمی سەر زەوی

ئەی سەربەپیاوی خائین    ئەی زاڵمی هەمیشە
ئەی کازیبی  دژی دین    ئەی خانی شرمەپیشە

ئەی حامیلی فەسادی    شایانی بەدنژادی
ئەی سەر شۆڕی زەمانە    دوژمنی باسەوادی

ئەی تەمبەڵنی سەربار    ئەی دوژمنی کرێکار
ئەی هەزدیهای خوێن خۆر    ئەی سەرزەلامی بەد کار

ئەی نامرۆڵی بەدڵ    ئەی خانی پیس و دەغەڵ
ئەی فیتنە گێڕی ئەمرو    سەرۆکی گورگ . چەقەڵ

ئەما دەوری ئەغامی    ڕۆژی تۆ لە بە ئەمڕۆ
بەر هەڵستی ئەزانی    ئەمڕۆ خورەیە بۆ تۆ

ئاغا سمێلی پانت    سوتەمەنی بروتە
سەرودیشی زەلامت    دزێوە مەڵکە مۆتە

ڕێ ڕەوی لار و هەڵدێر    زەوقی ڕۆشنایی
ئاموسڵمانی بێخێر    هەوێنی ناتەبایی

ئەی لارو چەوتو بەڵت          بۆگەل وەکو گیا کەڵە
یا خوانلوت بەھوتی          لەسەر ئەم خاک و گڵە

دوژمنی دین و دنیاو          موسلمانی وطّاتی
زوحاکی گیانی خەڵکی          ئێستا چلۆنە ماتی

دارەبەستی قەتارە          بەعام لە کوردەوارە
ڕەسمی قەدیمتانە          ئەی حاکمانی دار قەدیمیتانە

ئەی ڕۆسیاھی دەوران          ئەی شەرمەسلری جاری
ئەی دوژمنی عەدالەت          خائینی کوردە واری

تۆبوی بە باری مەینەت          بۆ چینی جوتیاران
تۆبوی جیھانت شێواند          ئەی دوژمنی ھەژاران

جیھان ژێردەستی تۆبو          خەڵکت بەکەردەزانی
ئورەو ترسن و گرژی          دیارە خۆت نەزانی

قاتلی کەرو گاجوت          دزی لاو و منڵان
لەماڵ و مالی خەڵکە          بردوتانە بە تاڵان

سەرۆکی جەردەکانی          ڕەقیبی نیشتمانی
خۆپەسەندو غەلیزی          لە تۆوە ھایە خانی

خان تەویلەی وطّاغە          لەشاری سابڵاغە
ھەزار دیناری دێنێ          بۆپیاوی کەرو ئلغا

بە چی شانازی دەکەی          ئەسپی ڕەبازی دەکەی
ئەمن چیم ولەتۆچی          بۆبە من بازی دەکەی

ئەگەر عەبدین هەمومان　　جەوالین یا نە نوقسان
چیە فەرقی من و تۆ　　بابێت بڵێم کوڕی خان

نەغلامی بۆیە وێڵی　　خەرابەی بەجێ دێڵی
ڕۆژی خۆبابش دەزانی　　گوڵی یاوەکو دێڵی

لە گەڵ حاکمی ڕۆژێ　　خەرابەی هەڵ دەڕێژێ
شەیتانی سەرزەمینی　　دژی دین و نوێژی

چۆن با بە خانەکەمی　　زیددی قورئانەکەمی
لەبەرجەرابی کلرت　　جەولداری عەجەمی

ئەی خائینانی دەوی　　ئەی فەسادی سەرزەوی
دورن لە دین و ئیمان　　مفتەخۆری مل قەوی

لانەی خەتاو نەگبەتی　　پێش ڕەوی نەدلەمەتی
دوژمنی ژین و گەلی　　سەگی پاس و بابەتی

تێ دەکۆشی بۆ ستەم　　بویی بە سەرباری لەدەم
لە داخی زوڵمی تۆیە　　پەنادەبەم بۆقەڵەم

دیارە دەڕون ڕەشی　　لەشکرمان بۆ دەکێشی
خۆت بە ئاغا دەزانی　　دەبێ تاڵی بنۆشی

بابەداخ بتلێتەوە　　لەبیرمان ئاچێتەوە
ناهێڵین تازەلاوان　　ڕۆژی ئاغا بێتەوە

دەس بە یەک و دو بکا　　خەرابە زیندو وەکا
ئاغا ڕێگای نادرێ　　بیری ڕێ بەرو وەکا

بەدزی و بە پیاو کوژی　　خوێنی خەڵکی هەڵ مژی
ئێستا خەڵک حازرە　　رابوەستن بە دژی

باوی ئێوە نەماوە
ڕیاسەت هاتە گۆڕێ
هەرچی ڕەفتاری بەدبێ
بۆ ئاخری هەر دە دۆڕێ

ئەملادەوری ئاغامی
فڕێیدەن سفتە خۆری
ئاغایەتی بەسەر چو
بڕایەوە دەوری زۆری

گیسکە کۆڵە ، مەڕەبۆر
کووڕە شاخ پان ، بزنە مۆر
ئەماوە جاری جاران
کە لێت دەستاندم بەزۆر

سڵی چەن تەغار گەنم
بۆمەڕیشکی ئاغا بەرم
زوڵم و زۆری هەتا کەی
لەخودا ناکەی شەرم

داهاتی سڵم چیە
بۆچی ئینسافت نیە
ئاغا سپڵە و نەزانە
هەروەکو داری بیە

چت دابو مێ زەویەڕوت
لەسەری بۆ مە نابوت
ڕقی خۆت پێ دەڕێژام
لەسەرسڵانی پێشوت

یا خوا سەردەمێکێ جو
ئەستۆت هەڵوەبڕم ئەستۆ
ئامێنێ ئاغایە تی
دانیشە دەستە و ئەژنۆ

میرایەتی بەسەر چو
پاکی ژێرو زەبەر بو
هەموتان باش بزانن
ئەمازەمانی پێشو

ئەوەی ئەیدەپەرەستن
بۆ گێرەداو دەبەستن
لەژێر فشار و دەنا
ئەوەی کەئەیدە ویستن

لە مەجلیسا هیچ کەسێ
نەتان دەکرد بە هاوسێ
جگە لە خۆد لە نوکەر
دەبو زمانی نەبێ

خەڵک لەباری مڵی
نەبو ژیان و حاڵی
یادەبو نۆکەری کا
یادانیشێ بە خاڵی

نەیدەوێرا قسەکا لەبەر نۆکەر و ئاغا
دەبودانیشێ لە ماڵ وەک مریشک هێلکەکا

زمانی بە سترابو لە زیندانێ کرابو
لەسەر ئەم خاک و هەردە ڕوناکایی نەمابو

ڕەعیەت دەڵێ بە ئاغا لەو ساڵ موڵکەتم بدا *
زستان نزیک بوتەوە تا بەهار دەرم نەکا

پێچوە شێرلە پیشماڵان لە جێگای قامیشەڵان
لەبەرسان هێزی نەبو بێت لە بۆ جەرگەی مەیدان

دەبی جلیان نوێ نەبێ پۆشاکی هەر کۆنەبێ
کڵاەک لەبەخەلی خا نابێ تێیدابەند بێ

دەبێ پینەکاکەوشی لەمەیە بارو بەشی
جێوو ڕێگای نادەبێ ژنی نەرێسی کەشی

لە بۆ ڕانک و چوغەی من دەبێ شەوێان نەخەون
ئەگەر قسەم بشکێنن لێتان دەبم بە دوژمن

ساڵێ کەنم بە خەروار جۆشم دەوێ بە تەغار
تفاقی گاو و گوێلیان دەبێ بۆم بێنن بە بار

مریشک و قەل و قاز شەک و مەڕی قاچ بازو
ئەگەر پاییز تەواو بو دەبێ بۆم بێنن هەمو

مەختەمان بۆ خۆی دیارە بە حیساب چەند هەزارە
دوانەکەوێ مەختەمان لەگەڵ باج و بێگارە

هەرئاغابو هەڵ دەهات      سەرشکاو ڕوح دەردەهات
دەچونە قەڵاکەیان      لات و کەوت و کزومات

منداڵ لە سەر بانەکان      بەربونە بەردەباران
بەردیان بۆ دەباری      وەکو تەرزەی بەهاران

سەروکوڵاکیان شکا      تێیان کەوتن بە تێلا
هەتازوری ملی خان      گشت هەڵاتن بە تیکڕا

بەر بوونە ماشێنەکان      شوشە کانیان گش شکان
دەس بەبەرد و لیسەوە      چونەدەوری ملی خان

هەرجەحێڵ بو دەیگوران      نەعرەتەی شێرە ژنان
دەتگی لەداوە زەوی      چوبۆچەرخی ئاسمان

بەڵێ بەگ و خانەکان      لە دیوەخانی خزان
هەتاکوسێ ڕۆژلەوێ      نەهاتنە دەرێ ئەوان

دالیشە شەرحی بکە      کە مێ فکری لێوەکە
هەشتانەئەمر ، لەیەک ماڵ      دەبی چەندە گوبکا

گشت دارو دیوارکەی      ئەو دیوی حەسارەکەی
بەگو سواغ درابو      ئەگەر بڕوام پێ دەکەی

سێ شەوو ڕۆژی تەواو      حەتتا نەچوونە سەراو
هەتا هەتا بمێنی      لەوەڵات بیدەن لەقاو

بەشی سێهەم

ڕۆڵەکانی نیشتمان      بولبولانی کوردوستان
سەدئافەرین بۆاێوە      دەرسێکی باش و دادان

پڕ لەشادی و لەوین بو   تاوانێکی دیرین بو
ئافەرین لەی دەست و خۆتان   باخی گوڵاو وشین بو

پسا ڕیشەی نزادی   تاوانە کەو هاتەدی
ئافەرین سەد ئافەرین   بمێنن هەربە شادی

باڵدار مەلانی ئێوە   لەسەر پەلانی ئێوە
هەربەئازادی بژین   سەد ئافەرین بۆ ئێوە

باخەکان کوێستانەکان   شاهیدیان دا بۆ ئەوان
مەدعی ئازادیی و دەکەن   چۆلەکەی سەربانەکان

ژیانیان هەر مردنە   ئەوەی بە خوێڕی دەژین
بێ وەجاخ و بی دەماخ   لە دنیا دا بێ بەرین

مردوون ئەوکەسانی   تەسلیی گومرا دەبن
نەفامن لەو وڵاتە   بێ بەشین حاشا بەرین

بێ دیانەتن ئەوانەی   سەربۆ زاڵم دادەخەن
زۆڵن ، مادەی پەرەستن   ڕۆڵەکەی ئەم خاکە نین

پاکیانتوش کە نوسیت   نیشتمانت خۆش دەوێ
بڵێ بەو خائینانە   بەزۆری سەرناکەوی

خۆپەرەستن فاسیدن   ئەونەفامانە هەمو
مەیلی پەستی وڵاتن   ئاغا و نوکەر دوبەدو

لەی ئاغاکانی چەپەڵ   لەی ڕەقیب و لەی دەخەڵ
سەرناکەون هەتاکەی   ڕیاکان و بەدەڵ

دوالەکەوێ پێی نەچێ — ئەوشۆ لەبیرو نەچێ
دەستور بە لێوە ئەدرێ — دەبێ بیکەن جێ بە جێ

دەبێ کچە کە و کڵە — کەلاوەچاردەسڵە
ئەگەر پێتونەم دەنێ — لێرە بونتان مەحڵە

ئەمەر دەنێرم سەرجەم — بۆ ئاغاکانی دەورەم
لە هیچ جێ ڕاوناگرم — دەستوریان وابێ ئەدەم

بەڵێ ساڵانی پێشو — ڕەعیەت لەبەو جۆرەبو
تازە ئەمیر چی بکا — بەدەمندوکێ پێوەبو

ئەڵێن ئازە نەماون — پەندی ڕۆژگار کراون
بۆتۆ هەر لەکەمین دان — دایم خەریکی ڕاون

تیرەی ئاغا زۆر کەرن — کەللە و شک و سەرسەرن
خۆزە مالیان لەماوە — لەویجدالیان بەدەرن

لەدینیش چونە دەرێ — خوسازدەکەن بۆشەڕێ
باسی خەرابی ئاغا — بە هیچ کەسێ ناکرێ

دەیان هەوێ مل بە مل — بەبەردی زل بدەن تل
بەمل هوری بە لەشکر — وڵات بکەن بە کاول

## «بەشی دوهەم»

## نجنێ خوارو

ئەو ڕۆژانە بەدەختەر — کۆبۆوە هەشتا نەفەر
لەمەنتیقەی بانەوە — کەلوێ و گەورک و پژدەر

دێیەک بە نێوی جەنێ — حازر بون کە بچنەوێ
دەیان هەویست وابکەن — هەرچی کە بۆیان بکرێ

ئەمما خەڵکی ئەودێنە    کاریان زۆر بەڕێ و جێیە<br>
پیاو ئاقڵ و دانای وێ    بەکجار زیرەکی لێیە

بۆدیفاع لە ناموسیان    بۆبونی چارە نوسیان<br>
دیفاع لە دین و ویژدان    دەبێ بڕۆنە مەیدان

بەڵام یەکجار بەوردی    بەپیاوانە و بە مەردی<br>
خۆیان ئامادە کردبو    لە بۆشەڕونەبەردی

وتیان ئاوکوڵ بێنن    وەکوشێربنە ڕێنن<br>
بەردەبارانیان بکەن    شاڵاویان بۆ بێنن

بە تێکرا ژن و منداڵ    پیاو و کیژی چاردە ساڵ<br>
ڕابوەستن لە بەرماڵ    شاڵاویان بۆ بهێنن

دەس پێکرابە شەڕێ    کە ئاغا خۆی ڕاگرێ<br>
کەدەور لێی نەگیرێ    بتوانێ خۆی دەربەرێ

خۆڕاگرێ بۆ جوتێر    ڕۆڵەی بە جەرگ و دلێر<br>
هەرگیز خۆی بۆ ناگری    ئاغای چەپەڵ و بێ خێر

ژن ، کەل و منداڵە کان    چەوڵەتیز بڵە کان<br>
ڕژانە کۆڵانەکان    بۆکوتانی خانەکان

دەکوترا بکرە بەردە    ئاویان کرا بەسەردە<br>
بەشی ئەوکارە دایە    ئەوی ئینسانە مەردە

ئاوی گەرم یا تیزاو    کرایە سەریان تەواو<br>
کران بە بوکە باران    کران بە پەند و بەباو

تازە ڕۆژی سەوادە
ئەمڕانی مان وەلادە
زەمانی زانیارییە
خەڵک دڵی گوشادە

ئەکەی سەربلەقێنی
قوڕت لەکەم بە شەلێ
دەوری سەوادو عیلم
موعەلیمە پێلە قێ

ئەوەی کە بۆی دەگەڕێن
دەبی لەقەبری بنێن
باشترلێت حالی دەبێ
لەسەرفکر یەکی بە جێن

کوڕانی جوتیاری زیر
بە ئەقڵ و بیرو تەدبیر
خوێندەوارو زیرەکن
تازەماون بە گزیر

ئەمڕۆ ڕۆژی خوێندنە
نەوەک ڕۆژی نوستنە
هەستن لە خەو ڕاپەڕن
دوژمن جەرگی کون کونە

چونکە تیری زانیاری
لەدوژمن بۆتە کاری
تازەڕۆژی شادیە
ئەما باوی هەژاری

وا ڕۆژی زانیارییە
ڕۆژی گەمە ویارییە
ڕۆژی بلغاتە ئەوڕۆ
ڕۆژی کونەک کارییە

ڕۆژی بلغاتە ئەوڕۆ
کەپروسابانە ئەوڕۆ
دنیاوە کوبە هەشتە
وەختی ئاواتە ئەوڕۆ

ئەوالەی بت پەرەستن
بۆ ئاغا گوێ لەمستن
ڕۆژی وان نیە ئێستا
سەردانە یا ویەستن

ڕۆژی تۆیە ئەی دلێر
ئەی جوتیاری وەکوشێر
وەرەسەیرانی ئێستا
ئاغا بووە سەرەو ژێر

دەستان خۆش بێ ئافەرین
فریشتانی ڕوی زەمین
لاوەکان شێرەژنان
ئەی پیرەکانی بەدین

جیێ سپاسی وەڵاتن — بەدەست و دەسەڵاتن
پیشەوای گشتی خەڵکن — ڕێ خۆشکەری خەباتن

خەبات دژی ملھوڕی — فەسادیو سیخوڕی
خەبات بۆ زانیاری — دژبە زوڵمی خوێڕی

کوردە وەرە هەڵپەڕە — ڕۆژی بەزم و شادیە
دەس لەدەستی یەک هەسو — بۆ موبارەک بادیە

ئەی ڕە ئیقان جەژنەوا — هەڵمژینی بادەیە
دەستە دەستەی لاوەکان — گوڵچیچە بە گزادەیە

سەدشوکر بۆ تۆ خودا — واشکان بە گزادەکان
لەو وڵاتە هەر نەمێنن — بابڕوون بۆ شارەکان

ڕێبەندانی /١٣٦٧/هەتاوی

## زاڵم (١)

گرۆی بێ چارەیی بێنان لەدەس زوڵم ئەناڵێنێ
موحەممەد خاوەنی قورئان کە ئاپاکان دەبو غزێنێ
فارو فەڵلەعزەمی دەوران وەکو شێر لێی دەگرمێنێ
لەبو بەکرو عەلیووعوسمان و تەی نەفرینی بلادێنێ
گەرچی زوڵم وەکو شەیتانلبەدولا کێنە دەنوێنێ

خوالەم عالەمەی خوڵقاند کەوا یەکتر بجو بێنن
وەکویەک لازمی یەکتر بە هەشتێکی بخوڵقێنن
لەژێر سایەی کەلامی حق نەمامی چاکە داچێنن
لەوەک ئینسانی بەد کردار بەمەزڵومان زەهرەژ بێنن
وەکو ماری کلک قرتاو ، لەبۆ توڵە دەهاژێنێ

کەوازڵم زەواڵم زەوڵە بۆ فەقیری ڕوی بێچارە
تەعەددی لێ دەکا بۆیە لەژێرِ دەستی گرفتارە
فەقیر دایم لەژێر کەلی جەرگی برینداره
ئەگەر دەتکیش بکالفەقیر، دەبینی والعەسەر دارە
لە فیکری کاری وادایەخەڵیران هەر بفەوتێنێ

لەترسی توڵەدیم زوڵم . قسەی حەق چو بووڵەیادم
بەسیاسەتی تۆ فەنابون . قامیل و خزم و ئازادم
ئەگەر ڕیلەت لەبن بێنم چ سەرخۆش و چ دڵشادم
بۆرشتنی خوێنی پیست دەست بەخەنجەر کەجەلادم
لەبیرم ناچی زوڵمی تۆ، هەستی من هەر دەبزوێنێ

ڕەفێقانم تەماشاکەن، لەبەردەم کاری خودادایە

فەقیری و دەوڵەمەندی خوا، لەحوکمی زاتی ئەودایە

بەیەک « کن و فیکون » دەیکا، کەسەیلی لێ بێ ئاوایە

فەقیردڵخوازی بەهەشتە کەچی زاڵم بەهیوایە

چیبری ئاتەوای وڵەمێشکی‌دا دەرەخسێنێ

کەمن جوتیار و مەزڵووم لەژێر زوڵمایە فەوتاوم

نیە دەستێ دەرم بێنێ لە ناوئەوچاڵە خنکاوم

بەنەشتەر بیدڕێنێ با ، بڵۆ می کێم و زوخاوم

لەوا خۆشی لەبو بۆ من ، غەریقی بەحری خویناوم

نیەهیچ کەس لە بۆ پاکی دەماخی بسوتێنێ

هەمیشە میللەتی کوردە لەژێر باری ستەم دایە

بەزۆری زێر چەپۆکی شا و گزیرو و ڕەب و ئاغایە

هەمودەم بە نەفرینی ، بەخیل و پیاوی گومڕایە

کوت و پڕ تاریکی لاچو ، تریشکی ڕۆژێ پەیدایە

کەچی ئێستالەگوڕاین دایەلاکی تازە دەروێنێ

## زاڵم ( ٢ )

شەرتە زاڵم بەدەستی خۆم ، موقەددەرگەرنەبێ ئاخر
پەتێکی وەت لەگەردن خەم ، بخنکێنی زاڵم ، ئەی کافر
کەچیە ئاسمانی توا، دەبێ بت هێنم وەک شاتر
وەژێر باری گرانت خەم ، زاڵمی پس وەکوشاتر
هەتا بژیم و بمێنم ، هەرقاتلێ زاڵمانم

وامە زانە کەمن کێژم ، ئەوە زاڵم مەبەستم بو
شەرتەزاڵم بت تەزێنم ، کە هەر ڕۆژێکی دەستم بۆ
کەهاتو من بەیەکجاری لەمەبر یارو قەستم بو
ئیتر ئامێنی لەم خاکە کەواهوشیاری هەستم بو
بەدەوری زاڵما شەو بێ بچەرخێم ، نانەڵێی خانم

ئەمن شەربێ هەتا ماوم دەبێ نوسراوی جوانیبێ
لەبۆ قەوتانی خان وەبەگ بەک دەمێنێرو کەوانم بێ
ئەوا هەستی دەرونی من لەبێ تیغی زەبانم بێ
بەرهەمی باش و بێ وێنەم دەبێ عەکسی زەمانم بێ
هەتاکەوڕوژە بیبینم ، بلێ بەگ منیش گاوانم

لەترسی خان وەبەگ جاران ، ئەمن دین و ئیمانم چو
نەتیجە شومی زۆری وان ، بەرهەمی سەرزەمینم بو
لەترسی شەومەزەنگی وان ، ئەمن خۆشی ژیانم چو
لەبەر گێژاوی ئاغاکان ، ئەمن روحی ڕەوانم چو
دژی ئاغارادەوستم ، هەتاکودەمردەچێ گیانم

هەتاکو ڕەنجبەرۆ و پاڵەوانی کونی لەدڵ دابێ

هەتاکو پیاوەتی و ویژدان لە لیباسی شەرەف دابێ

ئەگەر ئەم عاتفە گشتی لە مەیدانی هەدەف دابی

کەوائاغانەمابێ بێ ڕیشەی لەژێر ئەرزدابێ

پێی دەڕێژم هەموکینە ، دەری دێنم بەدەستانم

ئەگەر ئاغاخاکابێ ئەمن خۆشی ژیانم چی

کەبێتو فەرمان ڕەوابێ ئەمن دەردی بانم چی

کەبێتو دەوری ئاغابێ ، ئەمن باخی گوڵانم چی

کە خەڵکیش هەر ئەخەودابی ئەمن خۆشی ژیانم چی

ئەداخ و مەینەتی ئاغا ، من وەکو مەستی کێوانم

نە مردنە بۆمن کەمن حوبی ئەوانم بێ

کەهاتو هانەوە دوژمن ئەمن وێرای زەمانم بێ

پاکی تەماوم ئەمن ، کەلامی وا دەبانم بێ

قسەی حەق ئەمری خودایە واجب بو ئەسەرشانم

٢٠/ڕێبەندانی ١٢٥٧ی هەتاوی

# چوارینەکان

## پارچەهەڵبەستی

## ناڵەی ئاوارە

هوی خەڵە دەسەهەستەبەیانە
واسەعەت چوارە، کاتی مەیانە
ئاگرەی قالبدار لەمەیدانی وەستا
وەک قیامەتی ئاخر زەمانە

ناسەهەڵناسنم لە کوێم، بەوە
لەسێیرەمدیارن ، ئێستا هەرشەوە
قیرەی قالبدار بە تون ، بەمن چی
کاتی پشودان ، هەنگاوی خەوە

تەڵەی قالب دێ خەوم بۆنا کرێ
هەڵدەستم برۆم سەرم خۆنا کرێ
چاوم خەودان ، لەبۆم هەڵنایەن
خەو زۆر زاڵمە دەست هەڵنا گرێ

خەو حەرام بکە هەستە مەخەوە
ژن لێ دەکۆشن تۆمەلێ شەوە
ژن و پیاو کۆ تێکرا کار دەکەن
خۆڵەتۆ پیاوی، بیرێکە وە

کاتی قوتابی ، گوێ بگرە وەرە
کاتی پشودان نییە، کاتی فەنەرە
مەلێ پێنج شەمۆ، حەسانەوەیە
دەخیلم ئەڵێی وا دەردی سەرە

منداڵەکانی بەرێزم وەرن
لەژیانی مندا وەک تاجی سەرن
بێ ئیشان و بێ کار قەت دامەنیشن
بەکار و ئیشە زۆر بەختە وەرن

هۆکاکی قوڕسالار ، قوڕت دەربێنە
خوت ئازابکە ، وا رامە مێنە
قوڕحازربکە  هیچ ڕۆنەوەستە
شەمسوڵهاتە وە ، زۆر دڵ تەزێنە

.

قالبدار هەمو حەسا و ئەتەوت
پێیان ڕاناگەی ، تۆ وەخۆکەوە
سەیری کەمەیدان ، دەڵێی بەهەشتە
بە قوڕتێ کردن ڕازاوەتەوە

سەیری کە ڕیزی قالبداری جوان
وادێن وەدەچن کوران و کچان
ئەوانەتێکرا دەیکەن بەهەرا
بە موسابیقە دە ڕۆن هەمویان

سڵاوت لێ بێ لەی بێڵی قوڕێ
قوڕسالار بەدەمی تیزات دەخورێ
بەگیان و بە دڵ ڕێزت لێدەگرم
زگی قوڕوگل بەتۆ دە درێ

سوێندم بە کلکی زۆر شوش و چاکت
سوێندم بەدەمی تیزو چالاکت
سوێندم بە سەرت بێڵی بەرێزم
لەتاریخی تۆمن نابم ساکت

هەزاران دۆستی بێ وەفا دێنی
هەمیشەبۆمن تۆخەم ڕەوێنی
دوژمنی خان و بەگ و مفتەخۆری
بۆ ڕۆژی زیانم نەیبا هەوێنی

پورە گوڵندام بابڕۆینە مەیدان
بابچینە ڕیزی کوڕان و کچان
لاتکە لە کوڵ لێ قالب هەڵگرە
لە کورە خانە ناودێری زۆر جوان

باجی گوڵ ئەندامم وەگێڕە باجێ
لەبارەی بیور، تەوراس و داسێ
بۆچیکورد ئەبێ لە کورەخانەبێ
لەڕێی ژیانا خۆشی نەناسێ

هۆی باجی پەری «خستەنباشی»
وادیارە ئێستاکۆ گەلێ ناشی
چوار قالبی هەڵگرە ، سوکترە بۆ تۆ
تاعادەت بکەی پێشردا بەباشی

کاکی کۆرەچی بۆوا خامۆشی
پێم وایە ئەمڕۆ گەلێ نەخۆشی
پێم وایە زگ و پشتت ژان ئەکا
ئاوا دڵماوو کزو پەرۆشی

تۆ ئاریکەری بەش و دڵسۆزی
زۆر زۆرکار دەکەی چالاک و قۆزی
بۆسەرت لە بۆژناوە وەک ئەسیر
دەڵەی چاوت پڕبوە بە تۆزی

بۆیەزۆکاوی ، تۆزاوی و چڵکن
یا خوا هەمو دەم بەتۆبێ دوژمن
والەزانێت دێشێ تۆ چەماویەوە
یا زانە سەرت لە کەلە وەک من

لەری وایەمن کەوتومە گێژاو
هەموئەندامم بە قور سواخ کراو
سەرلەبەیانی کەدەچمە مەیدان
هەتا ئێوارە نایەمەوە دواو
.

غەیری زەمەکان من پشونادەم
ئەویش کەرەسمەزەم دەکەن بەهەم
خشت دەبێ ببرم بەڕۆژ و شەوێ
خەوم بۆناکرێ شێواوی ئەوەم

پێم دەڵێن دەبێ ، مەیلان تەمیز بێ
جێگایی بەرچونەی تۆنابێ پیس بێ
تەختیدە کەم و چڵی نایەڵم
ئاوپرژێن دەکەم ئاوەکو خیس بێ

تەختە مەیدانیان دامێ مەیدان کێش
پێم هەڵناگیرێ بە باری کەرێش
بەهەر جۆرێ بێ من هەڵی دە گرم
پێیدادەهێنم بەراکێش ڕاکێش

بڕۆمەیدانێ کچان کار دەکەن
زۆر بەشانازی ئاواتار دەکەن
دەیکەن بەخار و شادی و ڕەنترەتێن
هەزار ئافەرین بۆکیژی وەتەن

دەنگ و ئاوازی چونەوسەر ترانش
قالبی خوێن، ڕیزی خشتی بانش
دەنگیان ئەڕوا دوربە دوور
وەکو قرمژنی چەکوچی سەنگ ترانش

ئەی بژی کیژی ڕەسووری سابلاخ
دیلرە سەرخۆشی ئاڵزاو بەدەماخ
پێنج قالبیت پێیە ، موبارەکت بێ
دیلرە چالاکی ، بەکوڕ و کوستاخ

لاوی پیرانشار ئەتۆش بە خێربێی
خەڵکی ناوشاری ، یاخەڵکی لادێی
تۆبۆچی هاتی بۆ کورە برا
یابێکاریە ودلخداری ئەوێی

خەڵەی سەردەشتی تۆش وەهای لێرە
باسم بۆبکە شەرە یا خێرە
هۆی چیە خەڵکی کوردوستان لێرەن
هەرچی بیستوتە، بۆمی وەگێرە

خەڵکی هەرجێی ، سەقز ، بۆکانی
خەڵکی کرماشان ، یا مەریوانی
بێکار یا بە کار تۆ هەر ئو ئاوارەی
لەشارێکی دوور لە کوردوستانی

لێم گەڕێ هەستە وا ڕا مەمێنە
سەرێ لەهوورە بەسێ هەڵبێنە
چۆڕێ ئاو وەخۆ لەلای دالیشە
بلوەرمز نەبێ کەمێ بیدوێنە

سەلام پورە بەس ، هاتوم ئاووەخۆم
لیوانت بلوێ باکەمێ بیشۆم
«نادیوی دەرنێ، قوڕی پیوەیە»
تاڵەبیشۆمەوە لەو ئاوە ناخۆم

لێرە دوژمنی ئاووی سوێرم
لە ئاوی ساردیش من خۆڵەبوێرم
بەڵام مەجبورم هەربیخۆمەوە
ڕاستت پێ بڵێم، چاکیش ناوێرم

ئاوەکەی مەیدان ، زۆر تاڵ و سوێرە
دەڵێن مەیخۆوە ، تۆخۆت بیوێرە
زۆرم تینویە، لەڕێ چیبکەم
ئاوی سالمی لێ نیە ئێرە

من خەڵکی خاکی لای کوردستانم
من فێری ئاوی ساردو ڕەوانم
ئێستا ئاوارەم کەوتوومە لێرە
مەستی کولێرە و دوێنکە نانم

پاکی تۆهەستە ، قالب هەڵگرە
سەر تراشی لێدەو لەمەیدان بفرە
پیاوی بەغیرەت ، جەوهەری کارە
هەرکەس کاربکا ئەوشێرە کوڕە

وەرە قوڕتێکە قاڵب داربەوە
برۆ مەیدانێ قالب بڕکەوە
بە ئلزایە تی وەرە مەیدانێ
قەت مەڵێ گیانە وا نیوەی شەوە

له کورەخانه من لەناو قوڕم
قوڕاویه دایم ، پانتۆڵی شڕم
کاتێ پشودان که دەچمەوەماڵ
وەک مردوم ئەمن واسارد و سڕم

بەو حاڵەش وەها زوڵمم لێ دەکرێ
لەلایەن زاڵم بەشی من دەخورێ
کەزوڵم بەکا کاکی خۆ ملێ
زاڵم دەسوتێ خۆڕاناگرێ

کونم بۆ ڕادێرە هۆی خاڵە حەمە
لەمباسە لەبۆ کورە خانەمە
نانوسرێ بۆمن پاکی لەبۆتۆ
کەسێکی دەوێ وەک مامە خەمە

قاڵبدار دەڵێ ، ئای بۆ دەس کێشێ
خشتم بۆ نابڕێ ، دەستم دێشێ
بە کڵۆی نەخوساو دەس کێشم درا
تەواودەست و پێم ئاوادەقڵەشێ

هەمو پێکەوە دێن بەرەو مەنزڵ
چەندە ناخۆشە کاری نابەدڵ
دەچنە مەیدانی خشت بڕین دیسان
بولبولی شەیداڵە وێ دێتە کوڵ

خەڵکی ئالانی یا مامەخەلی
جەرگی داوە توێنم بڵێ عەلی
ڕیزی قاڵبدار که دەچنەوەماڵ
گێژ و هێژ بوون وەک بزنە شەلی

تۆڵاوانە بوی کەهاتی لە ماڵ
ڕەش هەڵگەڕاوی لێت براوە جەماڵ
ڕەنگت زردە بووە وەک ڕەنگی بەهێ
هەرخۆزیەم بە پارلەم ساڵ تا ئەوساڵ

لە کار کەوتوون بە قالبی گران
ڕویان کردۆتەلای بیمارستان
بەلێمە دەبڕن خۆخشتی تۆلی
هەر لەجێی خۆیەوا پوڵەکەمان

.

هەموکورەکان دوکتۆری دەوێ
دەبێ دەواکەر ڕاوەستێ لەوێ
لەبۆ ڕێدووروت لەوان وەک بران
والە کەمین دان بە ڕۆژ و شەوێ

پڕمادت دەوێ دەنوسێ هەزار
دەرزی کیلۆیی وەرگرە بە بار
بە خۆشی کورە لەم جوتە پیاوە
دەڕوتێنە وە کار گەری هەزار

گەرچی لە وڵاتی خۆم نیە کورە
گەرچی لاوالەم دورە
ئینسان کە زیریێ مننەت هەڵناگرێ
بۆژیانی سەربەرز ئاوابەم جۆرە

پیاواڵە بیورە هەموان
سەردانە خستن بۆ چەرخی زەمان
نانی بە مینەت بۆمە سندانە
پیاوانی بیورە والێژن پێمان

پیاوانە بژی و پیاوانە بمری
ڕابوێرە ژیان بە دەربەدەری
سەرداملەنوێنە بۆ ناپیاوان
بۆ تیکە نانێ مەکە نۆکەری

کار کردنی زۆر هەر وابۆ خۆمە
مەکەتەمبەڵی ئەمن بۆ لۆمە
جەوهەری ئینسان کارە و ئیش کردن
هەرکەس کار کەربێ ، قەت مەیکەن لۆمە

دواکەوتنی کارنەکەییە و نەنگە
هەستن ڕێ کەون ، هەستن دەرەنگە
ئەطفالی ئێستابونە ئێرانی
هەرچی کارکەرە بارەکەی لەنگە

ئەطفالی دەکەن کاربۆ ئەربابی
دڵێ ئێرانی تۆ بۆکار نابی
ئەطفالی دەگرم گەڵێ هەرزانن
ئەمن مەعلومە تۆوەها نابی

دنیای گیرفانە ، دنیا ، لێی گەڕێ
هەرچی ئەربابە دەڕواتە سەرێ
ئەبۆ گیرفانە کە خوێنت دەمژن
زالم وەستاوە هەریەک لە بەرێ

ئەرێ پێت چۆنە ئەم خوێن ڕشتنە
ئەم هەموگیرە و بگر و کوشتنە
ئەم کار و ئیشە گشتی بۆ پوڵە
لە بەرگیرفانە کە زوڵم وانە

کوردی بێکارم تاڵی دەچێژم
کاسبی دەکەم ئارەق دەڕێژم
سەرم داناخەم بۆ ئاسپاسان
ناحەقی ئێرە لە خاک دە نێژم

کار بۆگەڕایە ئەک بە خەنوەری
بەرەی خۆت نییە هەستە لەسەری
چەرخی ڕۆژگارە مەجبورت دەکا
بە ئاوارەیی و بە دەربە دەری

منەت لە شان و باڵم هەڵدەگرم
بو کورد دەژیم و کوردانە دەمرم
بۆوەی ئیحتیاجی نامەردان نەبم
لە کورەخانە دایم خشت دەبڕم

پاکی وڵاتم گەوهەری ڕوتە
شاخ و بەردەکەی دوڕڕ و یاقوتە
بێ کەسین هەژار ، بۆیە ئاوایە
زێدەم وێرانە، وەڵات ئابولە

زێدەم ئاوایە کەچی ناهێڵن
نیشتمان فرۆش پێم بەجێ دێڵن
ئەوان دوژمنی خاک و وڵاتن
لە هەرزەمانێ درۆزن و پێلن

هەژارم کوردم ئەمن بێکارم
کار بۆ نامەردە بۆیە داخ دارم
لە وڵاتی خۆم کاری لێ نیە
وێڵ و ئاوارەی ئەوشار ئەوشارم

ئەگەر وەک بەوری ، یا وەکو بازی
ئەگەر کار بکەی گیانە مومتازی
لەگەر پاڵەوان پاشێری ، نێری
هێشتا ئەربابت لێ نابێ ڕازی

تێ دەکەی قالب ، تاقتاقەبەچون
خشت دێنە دەرێ وەک قالبی سابون
ئاخری سالێش خشتێکت بشکێ
لێت تورە دەبێ وەک شێتو جنون

بەتۆدەگێرێ هەزار بەهانە
پێ دادەگرێ لە پوڵ ، دانە
مار بەفلسەی خۆش لە کون دێتە دەر
دەبێ بگونجێی لە گەڵ زەمانە

ئەگەر خشت دەشکێ ئەگەر گرۆڵە
هەمیشە ئەرباب ، بەموڵە ، بۆڵە
قالب ئەشکێنی ، ماسە زۆر لەبەی
تۆگونی پێ مەدە دەنگی دەمۆڵە

زۆربەش بە زیانی تۆ دەکاکەسە
ئینسافی نیە ویژدانی کەمە
لە نیوەی ساڵ داجوابت دەکات
ئەو هێندە تێرە لە تۆبێ خەمە

بەڵام ڕۆڵەی کورد، وریا و زرینگە
ئەرباب هەمیشە بە وینگە وینگە
قسەی بێ جێگابەرشتی نیە
وەکوچوایە ، دوکوڵبوی پنگە

گەرچی ئاوارەیی برای بەرێزم
سەرت بەرز کە بڵێ بە هێزم
چارەمان نیە ، زەمانە وایە
دوژمنە ئیتر بۆ گەل و هێزم

کەس نیە بڵێ ئەم خەڵکە بۆچی
سەرلێ شێواوون ، ئاوارە کۆچی
کەس نیە بدا لە دەمی زاڵم
پێی بڵێ ئاخر ، لەوچیە ، تۆچی

دنیا بە دەستی کەرو گایێکە
هەر جاشە کەرە خۆ پاشایێکە
دین دیدار کەسێکە نەزان و گێژبێ
هەرکەس کافرە ، وەک زانایێکە

بە سەربەرز بژی بە نان و ئاوێ
سەرت دانەخەبۆ هەر ناپیاوێ
دنیا هیچ نیە برای بەرێزم
مەفرۆشە مەردی لە پێناو ئاوێ

هەرکەس کەدەستی بگاتەنانێ
کۆشکێکی هەبێ کاتی شەو ژیانێ
ژیانی خۆشە بە دڵ ئازادە
بۆخۆی ئاغایە ، قەدری دەزانێ

دوژمنە بۆ ئێمە چەرخی ڕۆژگار
بۆ پیاوی فەقیر کەس نەماوە یار
لەتۆ لە ڕۆژگار جیانابیتەوە
گازت لێ دەگرێ وەکو سەگی هار

بە توانج و پلار یا بەدحاڵی
لە کورەخانەی یا لەسەر باخی
لە هەرلایێ بی ژێر دەستی لەتۆ
زوڵمت لێدە کا زاڵمی یاخی ،

کۆنە پەرەستان ڕێگات پێ دە گرن
سەرداڵدەخەن و بەحیزی دەمرن
حەق بێژی لایان پێت پێ دەکەن
ڕاستت پێ بڵێم ناحەق وەردەگرن

دەستی لێ مەدە لە خەرجی گران
وا خوێن ملن دەمژن دەس فرۆشەکان
تەواوی دنیا پڕ بو لە بێداد
تا سەر ئاوابێ ناخۆشە ژیان

کوردی بەلیم و بێ پەڕو باڵم
لەدەس ئەم چەرخە دایم دەناڵم
لە نیۆ تەپ و تۆز هەمیشە خەستەم
لەبەر ئەوەی من ڕوت و ڕەجاڵم

هەرگەلی کوردە ئاوا دەربەدەر
وایە ژۆکاوە بە دەردو کەسەر
دەبنە ژێردەستی سەرمایە داران
دڵی کورد دەردە تەولو سەر بە سەر

هەر گەلی کوردە کەلێی قەوماوە
ساڵەهای ساڵە بەشی خوراوە
کوردە بێ ماڵ و بێلانە کرا
کوردە ئاوارەی کورە و کەلاوە

قوچل بڕوا ١٣٧٢/٤/٢٥

# پشتیوانی قورئان

خۆ موحەممەد د خۆی دەفەرموێ ، دین لە غوربەت هاتەدی
دێتەوە غوربەت بە جارێ دەخیلم کومڕانەبی
دین لە غوربەت هاتەدی ، ئەی موسڵمان با پێت بڵێم
دینت دەر نابەی ئەگەر ئیسلام و وریا نەبی
ئۆقسەی قورئانێ شل کەی ، کەی موسڵمانی لەتۆ
زیندی قورئانی بنا سە زاهیرەن ئۆتە دی
بەرمو ڕوی بێدین بوەستە پێرەمەیدانی خەبات
گەر رموسڵمانی بە ڕاستی وایە فەرمودەی لەبی
ئەوپەڕێ قورئان ببینێ ، گەوشەکەی پێ دەستڕێ
هاتودین ئاواشکست بو ، ئۆیی موسڵمان بۆبی
گەرموسڵمان نی لەدین دەرچوبی بڵێ من کافرم
هەتاکەی تۆلە ژێرسایەی موسڵمان دێی و دەچی
ئەوهین بە ناموس و بەقورئان و بە دینی تۆلەکەن
وەک پڵنگێ ڕاپەرە هەستە هەتاکەی تۆئەزی
دینی ئیسلامێ پەرەی ساند، تێک شکان بتخانەکان
ئەی برا تۆباش بزانە دین بە زەحمەت هاتەدی
دەروێشیکی بێسەوادی هیچ نەزان چیبێمەلێ
هەجوی شێخی کە ئەبینی ئەت کوژێ وریا نەبی
دوژمنان دێن ئاشکرا، دەست لە قورئان وەردەدەن
ئەرهەرنر نیستتمی نێ بێبەکێ نابزوێ نەبی
موسڵمانی ڕاستەقینە هیچ ناترسێ لە دوژمن
ئەوموسڵمانی بەدینەکەی برا کوانی لەدبی
هەرکەسێ قورئان نەخوێنێ ئەوە دینی نیە
ڕوئەت هیچ بە کارنابێ لە نوێژابی یا نە بی

دین مەفرۆشە بە دنیا بۆ پلە و پایەو مەقام

دنیا پەرست ترسە نۆکە جالەتۆش با وانەبی

تۆ ئەڵێی وەموسڵمانم ، موسڵمانی تۆ کوا

حەملەبۆدینی تۆ دێنێ وەک مەرامی لەجەمی

موسڵمانی راستەقینە وانیە ، لەی برای بە رێز کوا

تێ کولت تلە، بێ بەری وەک دومەڵتو دارەبی

ئەو کە سەئبسلامی پاکە پەیرەوی ئیسلام بکا

جان فیدابێ خۆبە کوشت دا لەرێێ قورئان و نەبی

برێژرێت خوێنت لە رێگەی زەحتی قورئانێ برا

وەکوشێربێرە مەیدانێ ، سەرکەوە باسەر کەوی

دڵ مەبەستەبەم جیهانە مەچۆ سەر قەولی ئەوان

دنیا هەر بۆ ئیمتیحانە زەرەرەێ گومرانەی

مەچۆسەر قەولی ئەوانەی وادەڵێن کوردکافرە

بەرەو رویی وەک شێر بوە ستەبلێ تۆ لا مەسبەبی

لەو کەسەی دنیای دروست کرد لە نەبو هێنایە دی

پشتیوانی مەحکەمە بۆمە خودایی بەرزو ئەوی

پاکیا تۆش گەر موسڵمانی بە راستی وابکە

هەتا ماوی لە دنیادا، لە سەر رێی وی لانەچی